زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ یاریکرنێ



3

# ڕەوشتی یاریکرنێ

چیرۆك: فید براكاش

وێنە: هارفندەر مانكار



وەرگێڕان و ئامادەكرن:

دیان جەمیل

زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ یاریکرنێ


چیرۆك: فید براکاش

وێنە: هارفندەر مانکار

وەرگێڕان و ئامادەکرن: دیان جەمیل

پێداچوونا زمانی: مسلم عسمەت



ژمارا سپاردنێ: 2180یا سالا 2016




# یاریا تەپا پێی

کاروان و کارزان هەردوو هەڤالێن ئێك بوون ل پولا پێنچێ سەرەتایی. پشتی زەنگا وانەیا وەرزشێ هاتیە لێدان، هەموو قوتابی چوونە دناڤ باخچەی دا و هەر هندەکان بۆ خوە یاریەکا وەرزشێ کر. ڤان هەردوو هەڤالا ژی بریارا دا یاریا تەپا پێی بکەن.



ل وی دەمی هەڤالێ وان هونەر هاتە دەڤ وان و گوتێ: من دڤێت ئەز ژی یاریێ دگەل هەوە بکەم.

لێ کاروانی گوتێ: نەخێر مە نەڤێت تو یاریێ دگەل مە بکەی چونکی مە بریارا یا دای ئەم هەردوو ب تنێ یاریێ بکەین.



هونەر گەلەك تۆڕە بوو لەوا بزاڤ كر پێهنەكا بهێز ل تەپێ بدەت و ياريا وان تێك بدەت، لێ كارزانى ئەو ژ پشتێ ڤە گرت و نەهێلا پێ خوە ل تەپێ بدەت.



هونەری گوتێ: مادەم هوون نەهێلن ئەز یاریێ دگەل هەوە بکەم ئەز ناهێلم هوون ژی یاریێ بکەن.



دەمێ ماموستایا وان دیتی ئەو پێ شەڕی دکەن ئێکسەر بەرەڤ وان هات داکو بزانیت کا بوچی ئەو شەڕی دکەن.



پشتی ماموستا هاتیە دەڤ وان، هەر ئێك ژ وان ژلایێ خوە ڤە بزاڤ کر بۆ ماموستایێ دیار بکەت

کا بوچی وان شەڕ دکر و کا کی یێ ڕاست بوو و کی یێ شاش بوو.



ماموستایێ گوته كاروان و كارزانی: مادەم هوون حەز ژ تەپا پێی دكەن دڤێت گیانێ وەرزشی ل

دەڤ هەوە هەبیت و نابیت هوون چ جاران شەڕان بكەن.



ل دووڤ دا هونەری کرە گری و گوتە ماموستایێ: ئەز ژی گەلەك حەز ژ یاریا تەپا پێی دکەم لێ وان نەهێلا ئەز دگەل وان یاریێ بکەم.



ماموستایێ گوته وان: گەلی قوتابیان دڤێت هوون هەموو گاڤا هاریکاریا هەڤدوو بکەن و دگەل هەڤ د دلوڤان بن، و ئەگەر هەڤالەکێ هەوە ڤیا یاریان دگەل هەوە بکەت نابیت هوون ڕێگرییێ لێ بکەن.



کاروانی داخوازا لێبورینێ ژ ماموستایێ و هونەری کر ژبەر وێ ڕەفتارا وی کری کو نەهێلای هونەر دگەل وان یاریێ بکەت.



ل دوماهییێ هەموو قوتابی ل دور ماموستاییێ کوم بوون و سوز دایێ ئێدی ئەو شەڕان نەکەن،
بەلکو دگەل ئێك یاریا بکەن و دلێ هەڤالێن خوە نەهێلن.



کەیفا ماموستایێ ب ڤێ سوزا وان هات و گوتێ نوکە هەڕن پێکڤە یاریێ بکەن. قوتابیان پێکڤە یاریا تەپا پێی کر و هەتا وانەیا وەرزشێ ب دوماهی هاتی وان دەمەکێ خۆش بوراند.



# سەربوور:

هەموو گاڤا یێ هاریکار بە دگەل هەڤالێن خوە و دەلیڤێ بدێ ئەوژی دگەل تە یاریا بکەن.



# یاریا خوە ڤەشارتنێ

زەنگا بێهنڤەدانێ لێدا و قوتابی هەموو هاتنە ناڤ باخچێ قوتابخانێ داکو بۆ خوە یاریان بکەن.

هەر ئێك ژ نارین و بارین و سولینێ گوت: ئەم دێ ئەڤرۆکە یاریا خوە ڤەشارتنێ کەین.



ل دووڤ دا وان دەست ب یاریێ کر و سولینێ چاڤێن خوە گرتن و نارین و بارین ژی چوون دا خوە ڤەشێرن.



هەڤالا وان سیپەل هاتە ناڤ باخچەیی و گوتێ: من ژی دڤێت ئەز یاریێ دگەل هەوە بکەم.

لێ نارینێ گوتێ: ببورە تو یاریێ دگەل مە ناکەی چونکی ئەڤە بێهنەکە مە دەست ب یاریێ کری

.



هندی سیپەلێ داخواز ژێ کر کو ئەوژی دگەل وان یاریێ بکەت لێ هەرسێ هەڤالا داخوازا وێ ڕەتکر و چ پیتە پێنەکر و بەردەوام بوون ل سەر یاریا خوە.



سیپەل گەلەك خەمگین بوو، ئەو ب تنێ چوو جهەكی و ڕوینشتە خوارێ و كرە گری.



دەمێ بارینێ دیتی سیپەل یا دکەتە گری چوو دەڤ وێ ڕوینشتە خوارێ و گوتێ: تو بوچی دکەیە گری؟

سیپەلێ گوتێ: من دڤیا ئەز ژی یاریان دگەل هەوە بکەم لێ هەوە دەلیڤە نەدا من.



بارینێ گوتێ: ببوره هەڤالا مەیا یاریا خوە ب نیڤی کربوو لەورا ئەم نەشیاین تە گەل خوە پشکدار کەین، بەس ل سەر خاترا تە ئەم دێ دەست ب یاریەکا دی کەین.



هوسا گەلەك کەیفا سیپەلێ هات و هەر چاران پێکڤە دەست ب یاریەکا دی کر.



# سەربوور:

دەمێ هوون یاریان دکەن، ئەگەر هەڤالەکی داخواز کر ئەوژی دگەل هەوە یاریان بکەت، داخوازا وی ڕەت نەکەن

